[فەرمووی: ((فَهَلَّا جَارِيَةً تُلَاعِبُهَا وَتُلَاعِبُكَ] [تُضَاحِكُهَا وَتُضَاحِكُكَ))](٩٩٣) واتە: ((بۆچی کچت نەهێنا؟ یاری لەگەڵدا بکەیت و یاریت لەگەڵدا بکات، بیخەیتە پێکەنین وە بتهێنێتە پێکەنین)). [وتم: (کە (باوکم) عەبدوڵلا [شەهید بوو لەغەزای ئوحود دا](٩٩٤) نۆ کچی لە دوای خۆی بەجێهێشت منیش پێمخۆشنەبوو [هاوسەرگیری لەگەڵ] [ئافرەتێکی هیچ نەزانی وەك خۆیان بکەم] [کە هەڵنەسێت بە پەروەردەکردن و مشور خواردنیان](٩٩٥) [وە لەئەوەش ترسام کە نێوانی من و ئەوان تێکبدات](٩٩٦) بۆیە [هەڵسام بێوەژنێکم خواست بۆ ئەوەی خەمخۆریان بێت و پەروەردەیانبکات](٩٩٧) [فێری زانست و زانیارییان بکات](٩٩٨) [وە کۆیانبکاتەوەو] [خۆشەویستی و تەباییان لەنێواندا بکات](٩٩٩) [سەریانبشوات وشانەی بکات بۆیان](١٠٠٠) [نەهێڵێت ڕشك و ئەسپێ لەسەری یەکێکیان سەر هەڵدات و جلی دڕاوی یەکێکی تریشیان بدورێتەوە ئەگەر دڕا](١٠٠١) [فەرمووی: ((أَصَبْتَ][بَارَكَ اللَّهُ لَكَ]))(١٠٠٢) واتە: ((پێکاوتە خودا لێتپیرۆز و موبارەك بکات)) [((بەڕاستی تۆ باشترین بیروڕات هەبووە)، [هەروەها بووە ئافرەت دەخوازرێت لەبەر ئەم شتانە دینداری و ماڵو سامان و جوانییەکەی تۆ خاوەن دینەکەت هەڵبژاردووە، دەستی خۆت دیوە و حەساویتەتەوە))](١٠٠٣).

[کاتێك ڕۆیشتینەوە و (لەمەدینە نزیك بووینەوە) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((أَمْهِلُوا، حَتَّى تَدْخُلُوا لَيْلًا (أَيْ: عِشَاءً) لِكَيْ تَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ، وَتَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ)) واتە: ((لەسەر خۆ بڕۆن هەتا لەشەودا (ساتەوەختی عیشا) بچینە شارەوە، بۆ ئەوەی هاوسەرەکانتان

(٩٩٣) أخرجه: البخاري (٥٣٦٧).

(٩٩٤) أخرجه: البخاري (٤٠٥٢).

(٩٩٥) أخرجه: البخاري (٢٩٦٧).

(٩٩٦) أخرجه: البخاري (٥٣٦٧).

(٩٩٧) أخرجه: البخاري (٢٩٦٧).

(٩٩٨) أخرجه: البخاري (٢٤٠٦).

(٩٩٩) أخرجه: البخاري (٥٣٦٧).

(١٠٠٠) أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).

(١٠٠١) أخرجه: احمد (١٤٨٦١) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٠٠٢) أخرجه: البخاري (٥٣٦٧).

(١٠٠٣) أخرجه: النسائي (٣٢٢٦)، واحمد (١٤٢٣٧) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

سەرو قژیان شانە بکەن و پێستی لەشیان موی زیادەی لابدەن))][١٠٠٤] [کاتێك گەیشتینەوە (صرار) (ناوی شوێنێکە لە دووری (٣ میل) دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی مەدینەوە) فەرمانیکرد مانگایەکیان سەربڕی و خواردمان][١٠٠٥] [فەرمووی (بەمن): ((أما انك قادم)) واتە: ((تۆ دەچیتە ماڵەوە))][١٠٠٦] [((گەر گەڕایتەوە وریابە ژیرانە و زیرەکانە بڕۆرەوە)) [((لە کاتی عیشادا بچۆ وە لای هاوسەرەکەت][١٠٠٧] [ئەگەر شەویش چویتەوە ماڵەوە مەچۆ لای هاوسەرەکەت هەتا خۆی نەڕازێنێتەوە و مووی زیادە پێستی لەشی لانەبات وە پرچی شانە نەکات))][١٠٠٨] وە [کاتێك تەواو لەمەدینە نزیککەوتینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بە من: ((وشترەکەت چۆنە وچی دەکات؟))وتم: ئەوەتە][١٠٠٩] [فەرمووی: ((پێم بفرۆشە؟)) دەفەرموێت: شەرمکرد لەخزمەتیدا (و) بێجگە لەئەوە هیچ شتێکی ترم نەبوو ئاوی پێبهێنم و][١٠١٠] [پێویستیەکی زۆرم هەبوو بەئەو وشترە][١٠١١] [ئەویش فەرمووی: ((وشترەکەتم پێبفرۆشە]، وتم: پێشکەشت بێت، فەرمووی: ((نەخیر بەڵکو بەفرۆشتن دەبێت پێمبفرۆشیت))، وتمەوە: نەخێر، ئەوە پێشکەشی تۆ بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ][١٠١٢]، [فەرمووی: ((أَتَبِيعُ نَاضِحَكَ] [إِذَا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ إِنْ شَاءَ اللهُ بِدِينَارٍ وَاللهُ يَغْفِرُ لَكَ في رواية [اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ])) واتە: (([وشترەکەتم پێبفرۆشە بە پارە] [ئەگەر گەیشتینەوە مەدینە إِنْ شَاءَ اللهُ خودا لێتخۆشدەبێت.

لە گێرانەوەیەکی تردا [خودایە لێیخۆشبەو بیخەرە ژێر بەزەیی خۆتەوە]))[١٠١٣]

(١٠٠٤) أخرجه: البخاري (٥٢٤٧).

(١٠٠٥) أخرجه: مسلم (٤٠٨١).

(١٠٠٦) أخرجه: ابن حبان (٦٥١٨) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٠٠٧) أخرجه: النسائي (٤٦٥٢).

(١٠٠٨) أخرجه: البخاري (٥٢٤٦).

(١٠٠٩) أخرجه: احمد (١٤٣٧٦) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٠١٠) أخرجه: البخاري (٢٩٦٧).

(١٠١١) أخرجه: النسائي (٤٦٥٥).

(١٠١٢) أخرجه: مسلم (٤٠٧٧).

(١٠١٣) أخرجه: مسلم (٤٦٥٤).

وتم: ئەگەر گەیشتینەوە مەدینە ئەوە دەبێتەماڵی تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ[(١٠١٤)] [فەرمووی: ((تَبِيعُنِيهِ إِذَا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ إِنْ شَاءَ اللهُ بِدِينَارٍ وَاللهُ يَغْفِرُ لَكَ])) واتە: ((کە گیشتینەوە مەدینە بە دیناڕێك پێمبفرۆشە (إن شاء الله) خودا لێتخۆشدەبێت))[(١٠١٥)] وتم: وشتری خۆتە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [بەردەوام دینار دینار بۆی زیاد دەکردم لە کاتی زیادکردنی هەر دیناڕێکیش دەی فەرموو خوا لێتخۆشدەبێت هەتا گەیشتە بیست دینار][(١٠١٦)].

لە گێڕانەوەیەکی تردا [فەرمووی: ((تۆ وشترەکەت بە من دەفرۆشیت؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((بەچەند؟)) [وتم: من ئۆقیەیەك زێری کەسێك قەرزارم با بە ئوقیەیەك بێت تا بۆ قەرزەکەی دابنێم][(١٠١٧)] [فەرمووی بە من: ((بَخٍ بَخٍ، كَمْ فِي أُوقِيَّةٍ مِنْ نَاضِحٍ وَنَاضِحٍ))؟ واتە: ((بەخ بەخ (وشەیەکە دەردەبڕا وەك وەی وەی یان هەی هەی) بە چەند ئۆقیەیەك بۆ وشترێك ئەوە چ وشترێکە))]؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو مەدینەدا هیچ وشترێکی لێنییە بەلامەوە خۆشەویست تربێت لەمە وە هیچیان ناگەنەوە پێیفەرمووی: ((قَدْ أَخَذْتُهُ بِأُوقِيَّةٍ [فَتَبَلَّغْ عَلَيْهِ إِلَى الْمَدِينَةِ])) واتە: ((ئەوە بە ئۆقیەیەك لێمکڕیت [هەتا مەدینە پێی برۆ و دامەبەزە])), جابر دەفەرمووێت: دواتر لە وشترەکە دابەزیم، فەرمووی: ((ئەوە چی دەکەیت؟)) وتم: وشترەکە بۆتە هی خۆت. فەرمووی: ((سواری وشترەکەت ببەوە))... منیش سوار بوومەوە][(١٠١٨)] [(پاشان) فەرمووی: ((جابر ئێستا بڕۆرەوە ماڵەوە لای هاوسەرەکەت إِنْ شَاءَ اللهُ بەجۆرێك دەیانبینیت ئاواوئاوا خۆیان بۆتڕازاندووەتەوە هەتا باسی جێگاکەشیکرد، فەرمووی: ((جێگایەك بۆ پیاوەکە، جێگایەك بۆ هاوسەرەکەی سێیەمیان بۆ میوان و چوارەمیان بۆ شەیتانە))][(١٠١٩)]، [فەرمووی: ((چەندین ڕاخەر و فەرشتان بۆ ڕاخراوە؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەو ئەوانە؟ فەرمووی: ((هاوسەرەکەتان

---

(١٠١٤) أخرجه: مسلم (٤٠٧٨)، وابن ماجة (٢٢٠٥).

(١٠١٥) أخرجه: احمد (١٥٠١٣) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم، وابن حبان (٧١٤١) وقال محققه: صحيح.

(١٠١٦) أخرجه: مسلم (٤٠٧٨)، وابن ماجة (٢٢٠٥).

(١٠١٧) أخرجه: مسلم (٤٠٧٧).

(١٠١٨) أخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٠١٩) أخرجه: احمد (١٤١٢٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

ئەو ڕاخەرو فەرشانەی بۆ داناون))][١٠٢٠].

[جابر ﷺ دەفەرموێت: من پێش خەڵکی گەیشتمەوە مەدینە، خاڵم گەیشت پێم، پرسیارلێکردم لەبارەی وشترەکەمەوە منیش بۆم گێڕایەوە کە چیم لێکردووە؟][١٠٢١] [دەنگوباسی سستی وشترەکەم بۆ گێڕایەوە و ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردی بەرامبەری و پێیداکێشا و چاکبووەوە][١٠٢٢] [سەرزەنشتیکردم (لە سەر ئەوەی کە بۆچی وەك دیاری پێشکەشی پێغەمبەری خوام ﷺ نەکردووە؟)] دەفەرموێت (پاشان) سواری وشترەکەم بوومەوە هەتا گەیشتمەوە لای پورم، خوشکی باوکم لەمەدینە پێم وت: ئایا دەزانی وشترەکەم بەپێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتووە بە ئۆقیەیەك؟ دەفەرموێت: وام هەستکرد ئەوەی بەلاوە زۆر سەیر و سەمەرە بوو][١٠٢٣]، [ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ پێش من گەیشتەوە مزگەوت][١٠٢٤] [چوە ناو کۆمەڵێك لەهاوەڵانی کە بەشبەش لەناو مزگەوت بوون][١٠٢٥]، [ئینجا هەندێ گەڵای دارم هەڵگرتەوە و خستمە بەردەمی، پاشان جلەویمگرت و بردم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ][١٠٢٦] [گەیشتمە خزمەتی لەکاتی (چێشتەنگاودا) لەلای مزگەوت بوو][١٠٢٧]، [لەبەر دەرگای مزگەوت بینیم و فەرمووی: ((ئێستا (لەمکاتەدا) هێناوتە؟)) وتم: بەڵێ، فەرمووی: ((فَدَعْ جَمَلَكَ، فَادْخُلْ، فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ)) واتە: ((وشترەکەت واز لێبهێنە وەرە ژورەوە دوو ڕکات نوێژ بکە]))[١٠٢٨] (فەرمووی): وشترەکەم لەشوێنێکی نزیك مزگەوت بەستەوە))][١٠٢٩] ئینجا [چوومە ژورەوە و نوێژمکرد] [پاشان گەڕامەوە] [دەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ وەستاوە و کەسێك قسەی لەگەڵدا دەکات، وتم: ئەی

(١٠٢٠) اخرجه احمد (١٤١٣٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما.

(١٠٢١) أخرجه: البخاري (٢٩٦٧).

(١٠٢٢) أخرجه: البخاري (٢٤٠٦).

(١٠٢٣) أخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٠٢٤) أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).

(١٠٢٥) أخرجه: البخاري (٢٨٦٦)، واحمد (١٥٠٠٤) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري.

(١٠٢٦) أخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٠٢٧) أخرجه: البخاري (٢٣٩٣).

(١٠٢٨) أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).

(١٠٢٩) أخرجه: البخاري (٢٨٦١).

پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەت وەرگرتەوە لێم][1030] [تەشریفی هاتە دەرەوە و بە دەوری وشترەکەدا دەسوڕایەوە و سەیریدەکرد و دەیفەرموو: ((ئەم وشترە وشتری ئێمەیە))] [ئینجا جڵەویگرت] و [فەرمووی: ((باشترین وشتر وشترەکەی منە))][1031] [پاشان بانگی بیلالی کرد ﷺ و پێیفەرموو: ] [کیشی ئۆقیەیەك [لە زێڕ] [بۆ جابر] بکێشە][1032] وە قیراتێکی بۆ زیاد بکە].

لەگێرانەوەیەکی تردا فەرمووی: [بیلال لە غەنیمەکەش بیست دیناری پێبدە و زیاتریشی پێبدە][1033] [دەفەرموێت: لەگەڵ بیلال ڕۆیشتم] [داوای تەرازوی کرد [ئۆقیەکی] زێڕی بۆ کێشام بە زیادەوە][1034] [بە جۆرێك تەرازوەکە لا سەنگ بوو][1035] [جابر ﷺ دەفەرموێت: گەڕامەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بە پێوە وەستابوو قسەی لەگەڵ ئەو پیاوە دەکرد، وتم: ئۆقیەیەکی بەزیادەوە بۆ کێشام، ئەو مەساری خۆی تێك نەدا کە من بێئەوەی ئاگام لەخۆم بێت ڕێگەی ماڵەوەم گرتەبەر، دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگیکردبوو: ((کوا جابرلە کوێیە؟)) فەرموویان: [چۆتە وە ماڵەوە] [فەرمووی: ((جابرم بۆ بانگبکەنەوە))][1036] [بە (کەسێکی) فەرموو: ((بڕۆ بگە بە [جابر] و بیهێنەوە لام))][1037].

[جابر ﷺ دەفەرموێت: کەسێکی بەدوای مندا ناردبوو][1038] [ئەوە بوو نێردراوەکەی بەپەلە هاتە لام و فەرمووی: جابر پێغەمبەری خوا ﷺ بانگت دەکات] و [(لەدڵی خۆمدا) وتم: ئێستا وشترەکەم دەداتەوە هیچ شتێکم بەقەد ئەوە پێخۆشنەبوو][1039] [چومە خزمەتی] و [فەرمووی: ((جابر] [نرخەکەت بەتەواوی وەرگرت؟)) وتم:

(١٠٣٠) أخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٠٣١) أخرجه: احمد (١٥٠٠٤) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط البخاري.

(١٠٣٢) أخرجه: مسلم (٤٠٧٧).

(١٠٣٣) أخرجه: ابن حبان (٧١٤١) وقال محققه: صحيح.

(١٠٣٤) أخرجه: النسائي (٤٠٦٤).

(١٠٣٥) أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).

(١٠٣٦) أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).

(١٠٣٧) أخرجه: احمد (١٤٨٦٤) وقال محققه: اسناده صحيح.

(١٠٣٨) أخرجه: مسلم (٧١٥).

(١٠٣٩) أخرجه: البخاري (٢٠٩٧).

بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ][(١٠٤٠)] [فەرمووی: ((أَتُرَانِي مَاكَسْتُكَ (اي: ناقشت معك ثمن الجمل)) واتە: ((بینیت دەمەتەقێی نرخی وشترەکەتم لەگەڵ کردی تا وشترەکەتم کڕی))][(١٠٤١)] [فەرمووی: وشترەکەت بگرە و بیبەرەوە؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تازە وشتری من نییە، بووەتە موڵکی خۆت، فەرمووی: ((وشترەکەت بەرەوە))، دیسان وتم: وشتری من نەماوە [من وشتری تۆ نابەمەوە] ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ] [فەرمووی: ((فَخُذْ جَمَلَكَ، ذَلِكَ فَهُوَ مَالُكَ)) واتە: ((وشترەکەت بگرەو بیبەرەوە ماڵی تۆیە))][(١٠٤٢)] [((الثَّمَنُ والجَمَلُ لَكَ))][(١٠٤٣)] واتە: ((وشترەکەش و پارەکەش بۆ خۆت)) [و بگەڕێوە بۆ ناو ماڵ ومنداڵەکەت] [وەرمگرتەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: [وەڵاهی بەکارمان نەهێناوە بۆ هیچ شتێك لەئەو کاتەی تۆی لەسەر دابەزیویتەتە خوارەوە))][(١٠٤٤)].

[جابر فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکە و پارەی وشترەکە و بەشی تایبەتی خۆمی لەگەڵ خەڵکەکەش پێبەخشیم][(١٠٤٥)] [(دواتر لەگەڕانەوەمدا) بەلای کەسێکی جولەکەدا تێپەڕیم دەنگوباسەکەم بۆ گێڕایەوە بەسەرسوڕمانەوە وتی: وشترەکەی لێکڕیت و نرخەکەشی پێدایت و پاشان پێیبەخشیت؟ وتم: بەڵێ][(١٠٤٦)] [پاشان هاتمەوە بۆ لای پورم بە وشترەکەو ئۆقیە زێرەکەوە پێم وت: سەیرکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئۆقیە زێرەکەشی پێدام و وشترەکەشی بۆ گەڕانمەوە][(١٠٤٧)]. جابر ﷺ ئەو قینطارە زیادەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئۆقیەکەدا پێیدابوو، لای خۆی پاراستبووی هەر وەك خۆی دەفەرموێت: (وتم زیادەی پێغەمبەری خوا ﷺ نابێت لێمجیابێتەوە [خستمە ناو تورەکەیەکەوە کە هیی خۆم بوو]... ئەو (قیراط)

(١٠٤٠) أخرجه: البخاري (٢٨٦١)، واحمد (١٥٠٠٢).

(١٠٤١) أخرجه: مسلم (٧١٥).

(١٠٤٢) أخرجه: البخاري (٢٧١٨).

(١٠٤٣) أخرجه: البخاري (٢٨٦١).

(١٠٤٤) أخرجه: احمد (١٤٨٦٤).

(١٠٤٥) أخرجه: البخاري (٢٤٠٦).

(١٠٤٦) أخرجه: احمد (١٤٢٥١) وقال محققه: اسناده صحيح على شرط مسلم.

(١٠٤٧) أخرجه: احمد (١٤٨٦٤).

ە لە تورەکەی جابری کوڕی عەبدوڵڵا جیانەبووەوە)[١٠٤٨] وە ئەو وشترەشی لای خۆی پاراست کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشکەشیکرد هەروەك لەئەو بارەیەوە خۆی دەفەرموێت: (ئەو وشترە لەلام مایەوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکری صدیق ﷺ و عومەر ﷺ هەتا توانای نەما هێنامە خزمەت عومەر ﷺ، ڕووداوەکەی بیرکەوتەوە و فەرمووی: (بیبەرە ناو وشترەکانی صەدەقەوە لەباشترین لەوەڕگا دایبنێ ئەوە بوو بردم بەئەو شێوەیەی ئەو فەرمووی: هەروامایەوە تاکو مرد)[١٠٤٩].

**٢-گێڕانەوەی دووەم:** لەسەر ئەو ڕووداوە گێڕانەوەکەی ئیبنو ئیسحاقە ﷺ دەفەرموێت: وەهبی کوڕی کەیسان لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ بۆی گێرامەوە دەفەرموێت: (لەخزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچووم بۆ غەزای (ذات الرقاع) لەکاتی دەرچوونی بەروبوومی خورمادا [سواری] وشترێکی لاواز بووم [کە زۆر بەسستی ڕێگای دەبڕی] وە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی گەڕانەوەیدا هاوەڵەکانم منیان بەجێهێشت و دواکەوتم هەتا ئەوە بوو پێغەمبەری خوا ﷺ پێمگەیشت و فەرمووی: ((ئەوە چیتە جابر؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم وشترە دەستخەڕۆی کردم ناڕوات بەچاکی، [فەرمووی: ((یەخیکە))] منیش یەخمکرد پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەی خۆی یەخدا و فەرمووی: ((أَعْطِنِي هَذِهِ الْعَصَا مِنْ يَدِكَ)) واتە: ((ئەو دارەی دەستتم بدەیە)) یا فەرمووی: ((اقْطَعْ لِي عَصًا مِنْ شَجَرَةٍ)) واتە: ((داریکم لەئەو درەختە بۆ ببڕە)) فەرمووی: [دارەکەم دایە دەستی] پێغەمبەری خوا ﷺ وەریگرت و چەندین نەقیزەی تێوەژاند و فەرمووی: ((سواربەوە [جابر])) منیش سواربووم بۆی دەرچوو بە جۆرێك سوێند بەئەوەی کە پێغەمبەری بەحەق ناردووە پێشبڕکێی لەگەڵ وشترەکەی دەکرد کە جڵەویشم توند کرد بوو، لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتینە قسە کردن و فەرمووی پێم: ((أَتَبِيعُنِي جَمَلَك هَذَا يَا جَابِرُ))؟! واتە: ((جابر ئەو وشترەم پێنافرۆشیت؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشکەشتیدەکەم، فەرمووی: ((ڕازی نابم بەڵام پێم بفرۆشە)).

وتم: باشە چۆن خۆت پێت خۆشە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. فەرمووی:

---

(١٠٤٨) أخرجه: البخاري (٢٣٠٩)، ومسلم (٤٠٧٧).

(١٠٤٩) أخرجه: الحافظ (فتح الباري) (٤٠٣/٥) عن ابن عساكر.

((نرخەکەی چەندە؟))] تۆ ناوی خوای لێبێنە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ((بەدرهەمێك بمدەیە)) وتم: نەخێر زیاتر دەکات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((بە دوو درهەم)) دەفەرموێت وتم: نەخێر، دەفەرموێت: بەردەوام پێغەمبەری خوا ﷺ نرخەکەی بۆ زیاد دەکردم هەتا گەیشتە ئۆقیەیەك، ئینجا وتم: [ئیستا ڕازیم] وتم: بەسە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازیمبەئەوە؟ فەرمووی: ((بەڵێ))، وتم: [بەڵێ ڕازیم] ئەوەماڵی تۆیە، دەفەرموێت: ((وەری گرت، پاشان فەرمووی: [بەمن]: ((جابر ژنت هێناوە)) وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((کچە یان بێوەژن)) وتم: بەڵکو بێوەژنە، فەرمووی: بۆچی کچت نەخواست تا یاری لەگەڵدا بکەیت و یاریت لەگەڵدا بکات)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکم لە غەزای ئوحود دا شەهید بوو حەوت کچی لەپاش بەجێماوە، ئافرەتێکم هێناوە کە مشور خۆریانبێت و کۆیانبکاتەوە و سەریان بۆ شانەکات و [جلوبەرگیان بۆ بشوات]، فەرمووی: ((زۆر باشە کارێکی [چاکتکردووە] پێکاوتە إن شاء الله))، هەر کەگیشتینە ناوچەی (صرار) فەرمانیپێداین بەسەربڕینی وشتر و کەوتینە گۆشتخواردن، ئەو ڕۆژە پێداین کە گۆشەو سەرینمان دەبێت وتم: وەڵاهی سەرین وگۆشەمان نییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إِنَّهَا سَتَكُونُ، فَإِذَا أَنْتَ قَدِمْتُ فَاعْمَلْ عَمَلًا كَيِّسًا)) واتە: ((ئەوە لەمەودوا دەتبێت بەڵام کە چوویتەوە ژیرانە هەڵسوکەوت بکە)) جابر ﷺ دەفەرموێت: کاتێك گەیشتینە ناوچەی (صرار) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیکرد بە سەربڕینی وشتر ئەو ڕۆژە تێر گۆشتمان خوارد، کاتێك ڕۆژ ئاوابوو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتەوە ناو شار ئێمەش بەشوێنی ئەودا چووینەوە.

جابر ﷺ دەفەرموێت: قسەم لەگەڵ هاوسەرەکەمکرد (کەناوی سەهلەی کچی مەسعود بوو) ڕووداوەکەم بۆ باسکرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ چی بەمن فەرمووە؟ (لەبارەی سەرجێی لەگەڵ هاوسەرەکەی)، هاوسەرەکەی فەرمووی: [بیستمان وگوێڕایەڵ دەبین وژوور ئامادەیە] جابر ﷺ دەفەرموێت: ئەو شەوە بەیەکەوەماینەوە هەتا بەیانی] هەر کەڕۆژ بووەوە جڵەوی وشترەکەم گرت و بەرەو مزگەوت بردم هەتا لە بەردەم دەرگای مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ یەخمکرد، پاشان خۆشم لەناو مزگەوت لە نزیکیەوە دانیشتم پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە وشترەکەی بینی فەرمووی: ((ئەوە چییە؟)) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو وشترە جابر هێناویەتی

فەرمووی: ((جابر خۆی لەکوێیە؟)) بانگیانکردمە خزمەتی و فەرمووی: (([وەرە] کوڕی برام، جڵەوی وشترەکەت بگرە ئەمەش بۆ خۆت دەبێت)) بانگی بیلالیشی کرد وپێی فەرموو: ((بڕۆ لەگەڵ جابر ئۆقیەیەکی بدەیە)) جابر دەفەرموێت: لەگەڵیدا ڕۆیشتم ئۆقیەیەك وشتێکی زیادەی پێبەخشیم وەڵاهی بەردەوام لەلای خۆم دەمپاراست لەشوێنێکی تایبەت لە ماڵەکەمدا هەتا دوێنی دووجاری ئەو بەڵایە بووین بردیان وەك شتەکانی تر: (مەبەست لە جەنگی (الحرة)یە لەسەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویە))[1050].

## ١-سریەی غالبی کوڕی عەبدوڵلا بۆ سەربەنی مەلوح

دەنگوباسی ئەو سریەیە بەکورتی هاتوە لای ئەبو داودوحاکم، وە بەدرێژی هاتووە لەلای ئیمامی ئەحمەد و غەیری ئەویش، سەنەدەکەی بێهێزە (ضعيف) لێرەدا باسمانکردووە بۆ ئەوەی خوێنەر زانیاری هەبێت لەسەر درێژەی ڕووداوەکانی ئەم سریەیەو لەئەوبارەیەوە جوندبی کوڕی موکەیت جوهینی ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ غالبی کوڕی عەبدوڵلای کەلبی (كلب له ليث) نارد بەسریەیەکەوە بۆ سەر بەنی ملوح لەناوچەی (کەدیر)، فەرمانیپێکردین کە هێرش بەرینەسەریان، بەرێککەوتن منیش لەسریەکەدا بووم، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە (قەدید) لەئەوێدا توشی حارثی کوڕی مالك بووین کەناسرابوو بەکوڕی بەرصائی لەیثی دەستگیرمانکرد وتی: من هاتووم موسوڵمانببم، غالبی کوڕی عەبدوڵلا ﷺ وتی: ئەگەر وەك خۆت دەڵێیت هاتوویت موسوڵمانببیت ئەوە گیرانی شەو و ڕۆژێك هیچ زیانێکت پێناگەیەنێت، ئەگەر بەپێچەوانەوەش هاتبووی ئەوە دەستگیرت دەکەین و دەتبەستینەوە، فەرمووی: بەشریتێك بیبەستنەوە، دواجار کەسێکی ڕەشمان لەگەڵدابوو بەدیارییەوە جێیهێشت و پێیفەرموو: بەدیاریەوە بمێنەوە هەتا ئێمە دەڕۆین ئەگەر بەربەرەکانی کرد لەگەردنیبدە.

دەفەرموێت: پاشان ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە ناوجەرگەی ناوچەی (کەدیر)، لەعەسرێکی درەنگ لەئەوێدا خستمان، هاوەڵانم منیاننارد بۆ ڕێبەری پێشڕەوی

---

(١٠٥٠) أخرجه: احمد (١٥٠٢٦) وقال محققه: اسناده حسن والحديث صحيح، وأخرجه: ابن هشام (السيرة) (١٦٢/٣) برقم (٧٠٠) وقال الارناؤوط (زاد المعاد) (٢٥٤/٣): سنده صحيح، وكذا قال صاحب (صحيح السيرة) (٥٩٦): سنده صحيح، وقد رتبت رواية ابن هشام مع احمد والبيهقي (الدلائل) (٣٨٢/٣).

سریەکە بەسەر تەپۆڵکەیەك کەوتم کە بەسەریاندا دەیڕوانی، لەسەر ڕوو ڕاکشام لەسەر گردەکە، [تۆزێك] بەر لە خۆر ئاوابوون بوو بۆئەوەی نەمبینن، کەسێکیان هاتە دەرەوە منی بینی لەسەر دەم ڕاکشابووم لەسەر گردەکە، بەژنەکەی وت: وەڵاهی ڕەشاییەك بەدیدەکەم لەسەر ئەو تەپۆڵکەیە سەر لەبەیانی نەم بینیوە تۆ سەیرکە بزانە سەگەکان هیچ کەلوپەلی تۆیان نەبردوە، ڕۆیشت تەماشایکرد وتی: نەخێر وەڵاهی هیچ شتێکمان نەفەوتاوە، پیاوەکە پێیوت: تیروکەوانەکەم بدەیە دوو تیریشم لەناو هەگبەی تیرەکانم بۆ دەربهێنە، دایە دەستی ئەویش تیرێکی هاویشت دای لەکەلەکەم دەرم هێناو جوڵەم نەکرد لەجێگای خۆم پاشان ئەوی تریشی تێگرتم لەسەر شانی دام دەرمهێناو خستمە لایەکمەوە و جوڵەمنەکرد، بە خێزانەکەی وت: وەڵاهی تیرەکانم بەریکوتن ئەگەر ئاژەڵ بێت لەجوڵە کەوت سبەی دەچم تیرەکانم دێنمەوە وە ئەگەر بشخورێت تیرەکانیان پێناخورێت سەگەکان.

دەفەرموێت لێیانگەڕاین هەتا مەڕو ماڵاتەکەیان هێناو ئاویاندان و پاشان یەخیاندا و کردیاننە ناو تەویلەکانیان و دونیا کشومات بوو، ماوەیەك لەشەو تێپەڕی ئینجا لەهەموو لایەکەوە هیرشمان کردنە سەروو ئەوەی کوژرا لێیانکوشتمان و مەڕو ماڵاتەکەشیانماندایە پێش خۆمان ڕێگەمان گرتەبەر بەشێوەی قافڵەو گەڕاینەوە ئەوەبوو هاواری فریاکەوتنیان لێدا بۆ هۆزەکانیان داوای هاوکاریان لێکردن ئێمەش بە پەلە بۆی دەرچووین و هەتا گەیشتینەوە حاریثی کوڕی بەرصاء و پاسەوانەکەی لامان دانابوو ئەوانیشمان لەگەڵ خۆمان هەلگرت و ڕۆیشتین، هاوار و دەنگەدەنگی خەڵکەکە گەیشتە لامان، خەڵکی زۆریان بۆ کۆکردینەوە کە چارماننەدەکردن، هەتا وایلێهات نێوانمان لەناوجەرگەی دۆڵەکەدا بوو کە خودای گەورە لە هەموو لایەکەوە کردی بە بارانێك کە هەرگیز بەرلەئەوە باران و هەوری ئاوامان نەدیبوو، لافاوێکی بەخوڕی هێنا لەناو دۆڵەکە، ئێمەی لە ئەوان جیاکردەوە و بەجۆرێك بوو کە هیچ کەس لەئەوان نەیدەتوانی بپەڕێتەوە و بگاتەوە پێمان ئێمەش بەپەلە ماڵاتەکانمان دایە پێش خۆمان هەتا گەیاندمانە ناوچەی (مەشلەل) (کەشوێنێکە) پاشان لێژبووینەوە بەرەو خوار و دووژمنەکان نەیانتوانی بێن بەدواماندا و نا ئومێد بوون لەئەوەی ماڵاتەکانیان بسێننەوە لێمان)[(١٠٥١)].

(١٠٥١) أخرجه: احمد (١٥٨٤٤) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن هشام (السيرة) (٢٥٧/٤)، والطبراني (الكبير) (١٧٣٦)، وابوداود (٢٦٧٨)، والحاكم (١٢٤/٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، والبيهقي (الكبرى) (٨٨/٩) وفي

## ٢-سریەی غالبی کوڕی عەبدوڵڵای لەیثی بۆ ناوچەی (حرقات) لەبەنی جوهینە

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ غالبی کوڕی عەبدوڵڵای کەلبی (کەلب لیث) بەفەرماندەی سریەیەك نارد بۆ خاکی بەنی مورە، مەرداسی نوهەیك کە هاوپەیمانیان بوو لەبەنی حەرقەی هۆزی جوهەینە بوو، ئوسامەی کوڕی زەید کوشتی لەگەڵ کەسێکی ئەنصاری)[١٠٥٢].

لە گێڕانەوەی واقیدیدا: (یەسار خزمەتکارێکی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من زانیومە کە بەنی عەبدی کوڕی ثەعلەبە لەهەلێك دەگەڕێن کە لەناکاو بدەن بەسەرماندا، سریەیەك بنێرە من لەخزمەتیاندا دەبمە چاو ساغیان تا بەسەریاندا بدەین، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ غالبی کوڕی عەبدوڵلا بە سەد و سی کەسەوە نارد لەگەڵی.....)[١٠٥٣] وەك باسکراوە ئەم سریە نێردراوە لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا بوو. چەندین گێڕانەوە هاتووە بە وشەکاری جۆراو جۆر لە ڕێگەی جیاوازەوە لەسەر چۆنێتی کوشتنی ئەو موشریکەی کە وتویەتی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) دواجار کە لەلایەن ئوسامەوە کوژراوە ئێمە لێرەدا هەموویمان کۆکردووەتەوە لە دوو گێڕانەوەدا:

١-لەئەو بارەوە ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ خۆی دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی نارد بۆ ناوچەی حرقە. [لەگێڕانەوەیەکدا: (حرقات) بۆناو هۆزی جوهەینە]، لەبەرەبەیاندا دامانبەسەریاندا لەسەر ئاوەکەیاندا کەوتینە شەڕ لەگەڵیاندا [کەسێکیان تێدابوو جەربەزەبوو کاتێك ڕووبەڕوومان دەبوونەوە ئەو لە پاڵەوانە پێشڕەوەکانیان بوو لەدژمان دەوەستایەوە پشتیانهەڵدەکرد ئەو دەبووە پارێزەرو پاسەوانیان تا ڕایاندەکرد] وە ئەگەر کەسێکی لە موسوڵمانەکان مەبەست بووایە ئەوا بۆی دەچوو دەیکوشت] [ئەوەبوو تێکمانشکاندن] و [ڕایانکرد] من و پیاوێکی ئەنصاری گەیشتین بەئەو پیاوەی باسمانکرد کاتێك دەورماندا بەهەردووکمان وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ).

---

(الدلائل) (٢٩٨/٤)، وقال الهيثمي (المجمع) (٢٠٢/٦): رواه احمد والطبراني ورجاله ثقات، وقال الحافظ (الاصابة) (١٨٤/٣) (رقم: ٦٩٠٤): وقال ابوعمر رواه احمد بسند حسن، وضعفه الشيخ الالباني في (ضعيف ابي داود) (٥٧٣).

(١٠٥٢) أخرجه: الطبري (التأريخ) (١٥٧/٣)، وابن هشام (السيرة) (٢٣٥/٤)، والبيهقي (الدلائل) (٥٧٣).

(١٠٥٣) أنظر: (المغازي) للواقدي (٧٢٦/٢)، و(الدلائل) للبيهقي (٣٠٠/٤).

که ئەمەی وت ئەنصاریەکە دەستی لێهەڵگرت و وازیهێنا بەڵام من، بە ڕمەکەم لێمدا و کوشتم [شتێك لە دڵمدا دروست بوو لەسەر ئەوکارە] [ئەوە بوو سەرکەوتین وە مژدەدەر گەیشتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاریکرد لەئەو بارەوە ئەویش دەنگوباسەکەی بۆ گێڕایەوە و هەتا کوشتنی ئەو پیاوە کەچی بەسەر هاتووە و چۆن کوژراوە... بانگیکردم فەرمووی: ((بۆچی کوشتت؟)) منیش (ئوسامە) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ موسوڵمانەکانی شپرزەکردبوو، ئازاری پێگەیاندن وە فلان و فیساری کوشت ناوی چەند کەسێکم هەڵدا، منیش هەڵمکوتایە سەری کاتێك شمشێری بینی وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه)] [فەرمووی: ((کوشتت)) وتم: بەڵێ]، فەرمووی پێم: (يَا أُسَامَةُ، أَقَتَلْتَهُ بَعْدَ مَا قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ)) واتە: ((ئوسامە کوشتت لە دوای ئەوەی وتی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)). لە گێرانەوەیەکی تردا [((أَقَالَ: لَا إِلَهَ إلا اللَّهُ وَقَتَلْتَهُ))؟] واتە: ((ئایا وتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ) و تۆ کوشتت؟)) وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ [ئەوە لە ترسی چەك بووە] تا خۆی [لەکوشتن] ڕزگار بکات فەرمووی: ((أَفَلَا شَقَقْتَ عَنْ قَلْبِهِ حَتَّى تَعْلَمَ أَقَالَهَا [من اجل ذلك] أَمْ لَا، [مَنْ لَكَ بِلَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ إِذَا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) واتە: ((ئایا دڵت لەتکرد بوو هەتا بزانی [لەبەر ئەوە] ئەمەی وتووە یاخود نا و [کێ ڕزگارت دەکات لە (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ) کە ڕۆژی قیامەت هات)) [(وتم): ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە لای خوا؟ فەرمووی: ((كَيْفَ تَصْنَعُ بِلَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ إِذَا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) واتە: ((چیت کرد وە بەرامبەر (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) چی دەکەیت ئەگەر ڕۆژی قیامەت هات))]؟ بەردەوام ئەمەی دوبارە دەکردەوە [لە ڕوومدا] هەتا خۆزگەم دەخواست کە [بەر لەئەو ڕۆژە موسوڵمان نەبوومایە]])[١٠٥٤].

٢-لەعوتبەی کوڕی مالکەوە ﷺ دەفەرمویت: (پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی نارد بۆ سەر هۆزی موشریکی عەرەب هەڵیانکوتایە سەریان و کەسێکیان بە تەنیا دابڕا لە خەڵکەکە، پیاوێك لەسریەی موسوڵمانان شمشێریکی لێهەڵکێشاو شوێنی کەوت، پیاوەکە وتی: من موسوڵمانبووم، هیچ گوێی بە قسەکەی نەدا کە چی دەڵێت؟ شمشێریکی لێداو کوشتی [کاتێك گەڕایەوەو و هەواڵەکەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە بەئەو شیوەی کە ڕووی دابوو] [فەرمایشتێکی زۆر توندی فەرموو لەبارەی ڕووداوەکەوە گەیشتەوە بکوژەکەی] پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا و وتارێکی خوێندەوە

(١٠٥٤) أخرجه: البخاري (٤٢٦٩، ٦٨٧٢)، ومسلم (٩٦، ٩٧، ١٥٨، ١٥٩)، واحمد (٢١٧٤٥، ٢١٨٠٢) وقال محققه: اسناده صحيح على شرطهما، وابن حبان (٤٧٥١) واللفظ للبخاري والزيادات لمسلم والامام احمد.

و حەمد وستایشی خودای کرد و پاشان فەرمووی: ((أَمَّا بَعْدُ، فَمَا بَالُ الْمُسْلِمِ يَقْتُلُ الرَّجُلَ وَهُوَ يَقُولُ: إِنِّي مُسْلِمٌ))؟ واتە: ((سەرنج بدەن چۆن دەبێت موسوڵمانێك کەسێك بکوژێت کە بڵێت من موسوڵمان بووم؟)) پیاوە (بکوژەکە) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵاهی ئەوەی دەربڕی و گوتی تەنها لەبەر ئەوەی لە کوشتن ڕزگاری بکات. دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ڕووی لەپیاوەکە وخەڵکەکەشی وەرگێڕا کە لەلای ئەوە بوون، کەوتە سەرزەنشتی بە توندی لەخوتبەکەیدا، پیاوەکە خۆی پێنەگیرا بۆ جاری سێهەم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵاهی ئەو قسەیەی تەنها بۆ ئەوە بوو لەکوشتن ڕزگاری بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ ئینجا ڕوویتێکرد و سەیریکرد و ناڕەحەتی و نائومێدیم لەدەموچاویدا هەست پێدەکرد [دەستی ڕاستی بۆ درێژکرد وا] پێی فەرموو: (إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ أَبَى عَلَيَّ [فيمن] قَتَلَ [مسلما])) واتە: ((خودای گەورە داوام لێ دەکات پشت [لەئەو کەسە] بکەم کە [موسوڵمانێك] بە ناحەق دەکوژێت)). [لە گێرانەوەیەکی تردا: ((خودای گەورە حەرامیکردووە لەسەرم کە باوەڕدارێك بەناحەق بکوژم] (سێ جار ئەمەی فەرموو))[١٠٥٥].

لە گێڕانەوەیەکی تردا پێیفەرموو: ((«فَلَا أَنْتَ قَبِلْتَ مَا تَكَلَّمَ بِهِ، وَلَا أَنْتَ تَعْلَمُ مَا فِي قَلْبِهِ)) واتە: ((نەخێر تۆ ئەوەت لێقبوڵ نەکرد کە وتی بەتۆ نەتزانیوە دڵی چی تێدایە)) لە گێرانەوەیەکی تردا: ((قَدْ قَالَ لَكَ بِلِسَانِهِ فَلَمْ تُصَدِّقْهُ عَلَى مَا قَالَ فِي قَلْبِهِ)) واتە: ((بە زمان پێیوتی بەڵام تۆ بڕوات پێنەکرد بەئەوەی کەلە دڵیدایە))[١٠٥٦]. ئوسامە ﷺ پابەند بوو بە وەسیەتەکەی پێغەمبەری خواوە ﷺ وە عەرزیکرد: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەیماندەدەم بەخوا هیچ کەسێك نەکوژم هەتا ماوم لەژیانمدا کە بڵێت (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)...)[١٠٥٧] هەر لەبەر ئەوەش بوو ئوسامە ﷺ بەژدارینەکرد لەئەو جەنگەی کە هەڵگیرسا لەنێوان ئیمامی عەلی و موعاویە دا.

---

(١٠٥٥) أخرجه: ابن ابي شيبة (المصنف) (٢٩٥٤٦)، والنسائي (الكبرى) (٨٥٩٣)، واحمد (١٧٠٠٩، ٢٢٤٩٠) وقال محققه: اسناده صحيح، والطبراني (٩٨٠/١٧)، وابي يعلى (٦٨٢٩) وقال محققه: اسناده صحيح، وابن سعد (٤٨/٧)، والحاكم (١٨/١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي، وابن حبان (٥٩٧٢) وقال محققه: اسناده صحيح، وصححه الشيخ مقبل في (الصحيح المسند) (٩٤٨).

(١٠٥٦) أخرجه: احمد (١٩٩٣٧) وقال محققه: اسناده ضعيف، وابن ماجة (٣٩٣٠)، والطبراني (الكبير) (١٨٩/١٨)، وحسّنه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة) (٣١٧٥).

(١٠٥٧) أخرجه: ابن هشام (السيرة) (٤/ ٢٣٥) (برقم: ١١٧٧).

## ٣-سریەی عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی سەهەمی

ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەفەرموێت: (کاتێك وەقاصی کوڕی موجذزی مەدلەجی لەغەزای (ذی قرد) کوژرا، عەلقەمەی کوڕی موجەذزی برای داوایکرد لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کەفەرمانبکات بەناردنی بەشوین بکوژەکانیدا بۆ ئەوەی پێیانبگات و تۆلەیان لێبکاتەوە)[١٠٥٨].

لە ئەبو سەعیدی خدریەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ عەلقەمەی کوڕی موجەذزی کردە فەرماندەی سریەیەك وناردی منیش لەگەڵی بووم هەتا گەیشتینە سەر ئەوانەی کە شەڕیان لەگەڵ دەکردین یاخود لە نیوەی ڕێگا، [کۆمەڵێك لە سریەکە داوایانکرد کە ڕوخسەتیانبدات تا بگەڕێنەوە] ئەویش عەبدوڵڵای کوڕی خوزافەی کوڕی قەیسی سەهەمی کردە ئەمیریان، کە لەبەژداربووانی غەزای بەدر بوو، کە کەسێکی قسەخۆش و سوعبەتچی بوو [لەیەکێك لەسەفەرەکانی دا وشتری پێغەمبەری خوای ﷺ برد بوو بۆ ئەوەی بەئەو کارەی بیخاتە پێکەنین][١٠٥٩].

منیش لەئەوکەسانەبووم کە گەڕامەوە، لەبەشێکی ڕێگاکە لاماندا بۆ حەسانەوە، خەڵکەکەش ئاگریانکردەوە بۆ خواردن ئامادەکردن و خۆگەرمکردنەوە لەبەری [ئەوە بوو عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە ﷺ فەرمووی پێیان]: ئایا گوێڕایەڵیکردنی ئیوە بۆ من پێویست نییە؟ وتیان: بەڵێ وایە. فەرمووی: من فەرمانتان بە هەرچی شتێك پێبدەم دەبێت جێیبەجێیبکەن؟ فەرموویان: بەڵێ. فەرمووی: [من فەرمانتان پێدەکەم] بەئەو مافە گوێڕایەڵیەی لەسەرتانە بۆ من کە خۆتان فڕێدەنە ناو ئەو ئاگرە. خەڵکەکە هەستان و ڕاوەستان بەرامبەری هەتا دڵنیابوو کە خۆیان فڕێدەدەنە [ناو ئاگرەکە] ئینجا فەرمووی: ڕاوەستن ئەوە تەنها سوعبەتم لەگەڵکردن [کاتێك گەڕانەوە] گەیشتنەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەمان بۆ گێڕایەوە فەرمووی: واتە: ((مَنْ أَمَرَكُمْ مِنْهُمْ (اي: من مولاة) بِمَعْصِيَةٍ فَلَا تُطِيعُوهُ)) واتە: ((هەرکەسێك فەرمانێکیپێکردن بەسەرپێچی لە فەرمانی خودا و پێغەمبەر ئێوە گوێڕایەڵیمەکەن))[١٠٦٠].

(١٠٥٨) أنظر: (السيرة) لابن هشام (٢٥١/٤) (برقم: ١١٩٢).

(١٠٥٩) اخرجه: الحاكم (٦٣٠/٣) وصححه ووافقه الذهبي.

(١٠٦٠) اخرجه: احمد (١١٦٣٩) وقال محققة: اسناده حسن، وابن ابي شيبة (٣٤١/١٤)، وابن ماجة (٢٨٦٣)، وابن حبان (٤٥٥٨) وقال محققه: اسناده حسن، وابي يعلى (١٣٤٩) وقال محققه: اسناده حسن، وحسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٣٢٤)، و(صحيح ابن ماجة) (٢٣١٢).

له گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە لە ئیمامی عەلی یەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی نارد کەسێکی ئەنصاری کردە ئەمیریان فەرمانیپێکردن کە گوێڕایەڵی بکەن و ملکەچ بن، دواتر لە شتێکدا توڕەیانکردبوو فەرمووی: [فەرمانتانپێدەکەم] کە چیلکەو چەواڵم بۆ کۆ بکەنەوە، ئەوانیش بۆیان کۆکردبووەوە پاشان فەرمووی: ئاگری تێبەردەن ئەوانیش هەڵیانگیرساند، ئینجا فەرمووی: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیپێنەکردن کە گوێڕایەڵیم بکەن و ملکەچی فەرمانەکانمبن؟ فەرموویان: بەڵێ وایە. فەرمووی: دەبچنە ناو ئاگرەکەوە [خەڵکانێك ویستیان بچنە ناویەوە] [و هەستانەوە و خۆیان ئامادەکرد کە بچنە ناویەوە] و سەیرییەکتریان دەکرد [هەندێکیان فەرموویان]: لە ترسی ئاگر باوەڕمان بەپێغەمبەری خوا ﷺ هێناوە و چووینە لای ئەو، هەر بەئەو شێوەیە مانەوە هەتاهاتەوە سەرخۆی و توڕەیەکەی نەما ئینجا ئاگرەکەی کوژاندەوە، کاتێك گەڕاینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەمان بۆ باسکرد [فەرمووی بەئەوانەی کە دەیانویست بچنە ناویەوە: ((لَوْ دَخَلْتُمُوهَا لَمْ تَزَالُوا فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)) واتە: ((ئەگەر بچوونایە ناو ئاگرەکە هەتا ڕۆژی قیامەت تیایدا دادەمانەوە)) بەئەوانەی تریشی فەرمایشتێکی جوانی فەرموو: ((لَا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ)) واتە: ((گوێڕایەڵی ناکرێت لە سەرپێچی کردنی فەرمانی خوا، بەڵکو گوێڕایەڵیکردن تەنها لەکاری چاکەدایە))[١٠٦١].

لەئەو بارەیەوە ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: ((خوای گەورە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْۖ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي شَيْءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيْرٞ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾ (النساء: ٥٩) واتە: [ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە! گوێڕایەڵیی فەرمانی خواو پەیامبەربن لەهەموو کاروبارێکدا وە بەرفەرمانی کاربەدەستان و کارسازانی خۆتانبن، واتە: بەقسەی ئەو کاربەدەست و زانایانە بکەن، کە لەخۆتانن. واتە: لەچوارچێوەی شەریعەتدا گوێڕایەڵیان بن ئینجا ئەگەر لەشتێکدا کێشەو ناکۆکیتان بوو بیگێڕنەوە بۆلای خواو پەیامبەر ﷺ، واتە: باتەنها قورئان و سوننەت دادوەرو حەکەمتان بن. بەڵێ پێویستە لەهەمووشتێکدا بگەڕێینەوە لای خواو پەیامبەر ﷺ، دیارە کەبڕیاری پەیامبەریش ﷺ هەر بڕیاری خوایە، وە نابێ بەهیچ تاغووتێك بڕوات هەبێت، ئەگەر باوەڕتان بەخواو بەرۆژی دوایی هەیە، دەبێت ئاوابێت ئەو کێشەو هەرایانە بگێڕنەوە بۆلای قورئان و سوننەت،

(١٠٦١) اخرجه: البخاري (٧٢٥٢، ٤٣٤٠)، ومسلم (١٨٤٠)، واحمد (٦٢٢)، وابي داود (٢٦٢٥).

جوانترو چاکترە بۆتان، چاکترین رەفتاریشە بۆداهاتووتان.] لەسەر عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی سەهەمی خوای گەورە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد بووی بەفەرماندەی سریەیەك و ناردبووی)[١٠٦٢]. لەلای ئیبنو سەعد بەسەرهاتی ﷺ ئەو سریەیە لەمانگی (ربیع الاخر)ی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا ڕوویداوە[١٠٦٣].

## ٤-سریەی ئیبنو ئەبو حەدرەدی ئەسلەمی بۆ ناوچەی غابە

باسی ئەم سریەیەش هاتووە لەلای ئیمامی ئەحمەد و ئیبنو هیشام بەسەنەدێکی لاواز (ضعیف) ئێمە لێرەدا بە کورتی باسیدەکەین بۆزانیاریتان، لە ئیبنو ئەبو حەدرەوە ﷺ دەفەرموێت: (داخوازی ئافرەتێکم کرد لە هۆزەکەی خۆم دووسەد درهەم مارەییەکەی بوو هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوای یارمەتیم لێکرد بۆ هاوسەرگیرییەکەم فەرمووی: ((چەندت مارەیی بۆداناوە؟)) وتم دووسەد درهەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سُبْحَانَ اللَّهِ، لَوْ كُنْتُمْ تَأْخُذُونَ الدَّرَاهِمَ مِنْ بَطْنِ وَادٍ مَا زِدْتُمْ، وَاَللَّهِ مَا عِنْدِي مَا أُعِينُكَ بِهِ)) واتە: ((سبحان الله ئەگەر ئیوە درهەمەکان لەناو جەرگەی ئەو دۆڵانە دەستخەن ئەوجار بۆتان دەستەبەر نابێت و زیاد ناکات وەڵاهی ئەوەندەم لەلانییە کەیارمەتی هاوسەرگیری تۆی پێبدەم))[١٠٦٤].

لەگێڕانەوەیەکی تردا لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەفەرموێت: (کەسێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئافرەتێکی ئەنصاریم مارەکردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێیفەرموو: ((هَلْ نَظَرْتَ إِلَيْهَا فَإِنَّ فِي عُيُونِ الْأَنْصَارِ شَيْئًا (یعني: صغراً))) واتە: ((ئایا سەیرت کردووە بەوردی چونکە لە چاوی ئەنصارییەکاندا شتێك هەیە (واتە: چاویان بچوکە) فەرمووی: سەیرمکردوە بەجوانی، فەرمووی: ((لەسەر چەند مارەت کردووە؟)) فەرمووی: لەسەر چوار ئۆقیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((عَلَى أَرْبَعِ أَوَاقٍ كَأَنَّمَا تَنْحِتُونَ الْفِضَّةَ مِنْ عُرْضِ هَذَا الْجَبَلِ، مَا عِنْدَنَا مَا نُعْطِيكَ، وَلَكِنْ عَسَى أَنْ نَبْعَثَكَ فِي بَعْثٍ تُصِيبُ مِنْهُ)) واتە: ((لەسەر چوار ئۆقە وەك ئەوەیە کە زیو لەڕووی ئەو شاخە دەربێنن ئەوەندەمان لەلا نییە کە ببەخشین بەڵام بەڵکو لەمەو دوا لەگەڵ سریەیەکدا بتنێرین

---

(١٠٦٢) اخرجه: احمد (٣١٢٤)، والبخاري (٤٥٨٤)، ومسلم (١٨٣٤)، وابـي داود (٢٦٢٤).

(١٠٦٣) انظر: (فتح الباري) (٧٣/٨)، (دلائل النبوة) (٢٩٠/٤).

(١٠٦٤) اخرجه: ابن هشام (السيرة) (٢٤٢/٤) رقم (١١٨٤)، وعنه البـيهقی (الدلائل) (٣٠٣/٤)، واحمد (١٥٧٠٦) وقال محققه: اسناده ضعيف، والطبراني (الكبير)، (٢٢/ ٨٨٢).

ودەستکەوتێك ببێت)). ئەبو هورەیرە ﷺ فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەکی نارد بۆسەر بەنی عەباس و ئەو پیاوەشیی نارد لەگەڵیاندا))[١٠٦٥] ئەو فەرموودەیە ڕاستە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە سریەکە و ڕووداوەکە ڕاستەقینەن، بەڵام ئیبنو ئیسحاق لە گێڕانەوەیەکدا دەفەرموێت: (ناردنی سریەکە بۆ سەر بەنی جوشم بووە، هەروەك ئیبنو ئیسحاق ﷺ دەگێڕێتەوە لە ئیبنو ئەبو حەدرەوە ﷺ دەفەرموێت: (چەند ڕۆژێك بەئەو جۆرە ماینەوە تا کەسێك هات لەبەنی جوشمی کوڕی موعاویە کەناوی: ریفاعەی کوڕی قەیس یا قەیسی کوڕی ریفاعەبوو لەگەڵ بەشێکی گەورەو زۆری هۆزەکەی خۆی بەنی جوشەیم بۆ پشتیوانی هاتبوون لەناوچەی (غابە) دابەزین وخستیان مەبەستی بوو کە هۆزی (قەیس) کۆبکاتەوە بۆ جەنگوهەرا بەرپاکردن لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کە خۆی کەسێکی خانەدان و بەناو بانگ بوو لەناو هۆزی جوشم. لە گێڕانەوەیەکی تردا: (بەئەو شیوەیە مامەوە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردم وکردمیە فەرماندەری سریەکە و ناردمی بەرەو خاکی نەجد فەرمووی پێمان: ((اخْرُجْ فِي هَذِهِ السَّرِيَّةِ لَعَلَّكَ أَنْ تُصِيبَ شَيْئًا فَأُنَفِّلَكَهُ)) واتە: ((برۆ لەگەڵ ئەو سریەیەدا بەڵکو شتێکت دەستکەوێت بەئەو بیدەم بەخۆت)) دەفەرموێت: ڕۆیشتین تا دەمەو ئێوارانێ گەیشتینە ناوچەکەیان، کاتێك تاریکی شەو ڕۆیشت ئەمیرەکەمان دووکەس دەیان ناردین تا دەوری سەربازگەکەمان گرت....)[١٠٦٦].

لەدواین گێڕانەوەدا هاتووە: (...وشترو مەڕ وماڵاتێکی ئێجگار زۆرمان دەستکەوت پێشخۆمان داو هێنامانەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ... پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو وشترەکان بە سیانزە وشتر هاوکاری کردم بۆمارەییەکە وەمنیش کۆمکردەوە و بردم بۆ هاوسەرەکەم)[١٠٦٧].

چەندین سریەی تریش هاتووە لەبەر لاوازی سەنەدەکانیان لێرەدا باسمان نەکردووە لەئەوانە: سریەی عومەری کوڕی خەطاب ﷺ بۆ (توربە)، سریەی (بەشیری کوڕی سەعیدی ئەنصاری ﷺ بۆ بەنی مورە، بۆ سەر خاکی غەطەفان. و شوێنی تریش.

---

(١٠٦٥) اخرجه: احمد (٧٩٨٤٩)، ومسلم (٣٤٧١)، والنسائي (٣٢٣٤)، وابن حبان (٤٠٤١).

(١٠٦٦) اخرجه: احمد (٢٣٨٨٢) وقال محققه: اسناده ضعيف.

(١٠٦٧) اخرجه: ابن هشام (السيرة (٢٤٢/٤)، والبيهقي (الدلائل) (٣٠٣/٤).

# عەمرەی قەضاء

موسای کوڕی عوقبە ﷺ لە ئیبنو شیهابی زوهرییەوە ﷺ دەفەرموێت: (ئەوە بوو ساڵێك لەدوای ڕێککەوتننامەی حودیبیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بەجلی عەمرەوە دەرچوو بەرەو مەککە لە مانگی (ذي القعدة) ساڵی حەوتەمی کۆچی کەهاوکات بوو لەگەڵ ئەو مانگەی کە موشریکەکان ڕێگەیان نەدا بچینە (مزگەوتی حەرام) (١٠٦٨) هەموو ئەوانەی لەحودەیبیەدا بەژداربوون بەژداری ئەم عەمرەیەیان کرد تەنها ئەوانە نەبێت کە کۆچیدواییان کردبوو یان شەهیدببوون، وە لەگەڵیاندا خەڵکی تریش بەژداربوون کە ژمارەیان دەگەیشتە دوو هەزار کەس(١٠٦٩).

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی لەشاری مەدینە دەرچوون لە ناوچەی (ذي الحليفة) ئیحرامیانبەست بە ویردی (لبيك)وە ڕۆیشتن، شەست وشتری (هدية)یان بۆ قوربانی پێش خۆیان دابووبە سەرپەرشتی ناجیەی کوڕی جوندب ﷺ (١٠٧٠) وە چەك و پێداویستی جەنگیان بەتەواوی ئامادە کردبوو و هێنا بوویان لەگەڵ خۆیان لە ترسی پەیمانشکێنی قورەیش، عەمری کوڕی قەتادە ﷺ دەفەرموێت: (چەك و پێداویستیەکانی شەڕیان لەشمشێر و ڕم و تیروکەوان هەڵگرت لەگەڵ سەد ئەسپسوار بەسەرکردایەتی بەشیری کوڕی سەعدی ئەنصاری ﷺ کردیانە سەرپەرشتیاری چەکەکان، وە موحەمەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری ﷺ کرایە فەرماندەی ئەسپسوارەکان)(١٠٧١).

پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕێگەی مەککەدا کەڵەشاخی بۆ کرا کە لە ئیحرامیشدا بوو لە ناوەڕاستی سەری(١٠٧٢). لەگێڕانەوەیەکی لاوازدا (ضعيف)دا هاتوە ئێمە لێرەدا باسی دەکەین تەنها بۆ زانیارتان کە واقیدی دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ (لبيك)

(١٠٦٨) اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣١٤/٤)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٨٩): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

(١٠٦٩) اخرجه: ابن سعد (الطبقات) (٦٧/٣)، والحاكم (الأكليل) كما في (الفتح) (٦٣٧/٧).

(١٠٧٠) في رواية عن ابي حدرد ان البني r قال: ((من يسوق ابلنا هذه)) ؟ فقام رجلٌ، فقال ((ماسمك))..قال: ناجية. قال ((انت لها فسقها))). اخرجه: البخاري (الادب)، (٨١٢)، والحاكم (٢٧٦/٤)، وضعقه الشيخ الالباني في (الضعيفة) (٤٨٠٤)، و(ضعيف الادب المفرد) (١٢٨).

(١٠٧١) اخرجه: الطبري (التأريخ) (٣٦/٣).

(١٠٧٢) اخرجه: البخاري (١٨٣٦)، ومسلم (١٢٠٣) واللفظ له.

دەفەرموو موسوڵمانەکانیش لە خزمەتیدا (لبیك)یان دەفەرموو، موحەمەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری ﷺ بە ئەسپسوارەکانەوە ڕۆیشت هەتا گەیشتە (مرّ الظهران) لەئەوێدا (چاویان) کەوت بەچەند کەسێکی قورەیش، پرسیاریان لە موحەمەدی کوڕی مەسلەمە ﷺ کرد ئەویش فەرمووی: ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ سبەی إن شاء الله دەگاتە ماڵی خوا، کە ئەو چەك و تفاقە زۆرەیان بینی لەگەڵ بەشیری کوڕی سەعد ﷺ بەپەلەو خێرا ڕۆیشتنەوە هەتا گەیشتنەوە لای قورەیش هەواڵیانپێدان بەئەوەی کە دیبوویان لە چەك وئەسپی جەنگ، قورەیش دووچاری ترس و دڵەڕاوکێ بوون و وتیان: وەڵاهی هیچ کارێك لەسەر دەستی ئێمە ڕوونەداوە ئێمە لەسەر دانووستانی خۆمانین لەبەرچی محمد وهاوەڵانی هێرشمان بۆ دێنن؟ پێغەمبەری خوا ﷺ لە (مرّ الظهران) لایدا و دابەزی چەك وپێداویستیەکانی جەنگی ڕەوانەی ناوچەی (یأجج) کرد (کە هەشت میل لە مەککەوە دوورە) بەشێوەیەك هەڵکەوتووە لێیەوە دەیڕوانی بۆ پایەکانی حەرەم).

قورەیش بۆ ئەو مەبەستە موکەریزەی کوڕی حەفصی کوڕی ئەحنەفیان لەگەڵ چەند کەسێکی تر نارد.... لەئەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو هاوەڵانی بوو، وشترەکانی قوربانی (هدیە) و چەك و تفاق کەوتبوونە ئەو ناوچەیە، وتیان: محمد ﷺ نازانین ئێمە لەبچوکەوە تا گەورە پەیمانشکێنمیان لەتۆ نەبینیوە لەبەر چی دەتەوێت بەچەکەوە بێیتە حەڕەمەوە بەسەر خزم و کەسوکارەکانتدا بدەیت ئەوان مەرجیان لەگەڵ دانای کە بە چەکی گەشتیارییەوە نەبێت نەیەیتە مەککەوە ئەویش شمشێرە لە کیلاندا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((من بەچەکەوە نایەمە سەریان))، موکەریزەی کوڕی حەفص وتی: ئەو تایبەتمەندیەی کە تۆی پێدەناسریتەوە چاکی وەفادارییە بەرامبەر پەیمان، پاشان خۆی و هاوەڵانی بەپەلە گەڕانەوە بەرەو مەککە وتی: محمد نایەتە مەککەوە بە چەکەوە و لەسەر ئەو شەرتوبەڵێنەیە کەلەسەری ڕێککەوتون))[١٠٧٣]. پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست هاوەڵانی بەهێزو چوست وچالاکیەوە بچنە ناو مەککەوە هەر لەبەر ئەوە داوایکرد هەموو زادە و زەخیرەیان بۆ کۆکردەوە و نزای خێری لەسەر خوێند ودوعای بەرەکەتی بۆ کردن دەستیان کرد بە خواردن و تێریانخوارد.

---

(١٠٧٣) اخرجه: الواقدي (المغازي) (٧٣٤/٢) وعنه ابن كثير (البداية) (٢٣٦/٤).

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرمویت: (کە پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی لە (مرّ الظهران) لەکاتی [عەمرەکەیدا] کە لەڕێککەوتندا بوو لەگەڵ قورەیش، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانگەیشتبوو کە قورەیش وتویانە: [ناتوانن هەستنوبڕۆن لەبەر نەخۆشی وبرسێتی، هاوەڵان عەرزی پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر هەندێك لەوشترەکانمان سەرببڕین]، [گۆشتەکەی] بخۆین ولە گۆشتاوەکەی بخۆینەوە سبەی کە چوینە مەککەوە بۆ ناو قورەیش تا بە تێری و چوستوچالاکیەوە بمانبینن؟ فەرمووی: ((لَا [تفعلوا] وَلَكِنِ ائْتُونِي [واجمعوا لِي] مِنْ فَضَلَ أَزْوَادِكُمْ)) واتە: ((نەخێر [وشترەکان سەر مەبڕن] بەڵام هەرچی زادو زەخیرەتان هەیە بیهێننەوە ئێرە)) ئەوەبوو سفرەیان ڕاخست و هەرچی پێخۆرێ هەیان بوو کۆیانکردەوە لەسەری، پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بەرەکەتی بۆکردن، ئینجا کەوتنە خواردنی هەتا تێریانخوارد و ئەوەی زیادەش بوو خستیانە تورەکەو جەواڵەکانیانەوە...)(١٠٧٤).

پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی ئامۆژگاریکرد کە چوونە مەککەوە بە چوستوچالاکی و جەربەزییەوە بچنە ناویەوە وهێزی خۆیان دەربخەن، لە ئیبنو عەباسەوە ﷺ دەفەرمویت: کە (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرموویەتی بە هاوەڵانی کاتێك ویستوویانە بۆ عەمرە بچنە مەککەوە لە دوای ڕێککەوتننامەی حودەیبیە: ((إِنَّ قَوْمَكُمْ غَدًا سَيَرَوْنَكُمْ، فَلَيَرَوْنَكُمْ جُلَدَاءَ)). واتە: ((سبەی خزم و کەسەکانتان لەقورەیش تەماشاتان دەکەن بابە هێزو تواناوە بتانبینن وسەیرتانبکەن))(١٠٧٥).

ئیبنو شەهاب ﷺ دەفەرمویت: ((پێغەمبەری خوا ﷺ) گەیشتە ناوچەی (يأجج) و هەرچی چەك و تفاقی شەڕبوو داینا لە شمشێر و تیروکەوان و ڕم و قەڵغان و زرێ، تەنها بەچەکی سواربیەوە کە شمشیر بولەکێلاندا چووە مەککەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ جەعفەری کوڕی ئەبو طالب ﷺ ئامۆزای لەبریکاری خۆیەوە نارد بۆ خوازبێنی مەیمونەی کچی حارثی کوڕی حەزنی عامیری بۆ ئەوەی لێیمارە بکات

---

(١٠٧٤) اخرجه: ابوداود (١٨٨٦)، وابن خزيمة (٢٧٠٧)، والبيهقي (٧٩/٥)، واخرجه: احمد (٢٧٨٢) وقال محققه: اسناده قوي، وابن حبان (٣٨١٢) وقال محققه: حديث صحيح، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٦٦١).

(١٠٧٥) اخرجه: احمد (٣١٤/١)، وابوداود (١٨٩٠)، وابي يعلي (٢٥٧٤) وقال محققه: اسناجه صحيح، وابن حبان (٣٨١٤)، وقال محققه: اسناده صحيح.

بەوەکالەت...)[١٠٧٦] موشریکەکان کەوتنە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی ئەوەی کە موسوڵمانەکان برسێتی و ماندووبوون لاوازیکردوون بەرلەئەوەش تاو گەرمای مەدینە بێهێزی کردبوون، لەئەو بارەیەوە ئیبنو عباس ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی گەیشتنە شاری مەککە کە هەوای گەرمی مەدینە لاوازی کردبوون وبێهێز بووبوون موشریکەکان وتیان: سبەی خەڵکانێك دینە ناوتان تای گەرم بێهێز و لاوازی کردوون و دووچاری نارەحەتی و دژواریەکی زۆربوون)[١٠٧٧]. هەندێك لە پیاو ماقوڵ و گەورە پیاوانی قورەیش بەردەوام ڕق وقین و حەسادەتیان لە دڵ و دەرونیاندا دەشاردەوە چاویان بەئەوە هەڵنەدەهات کە سەیری پێغەمبەری خوا ﷺ و موسوڵمانەکان بکەن، کە بە ئاشکرا لەمەککەدا مەراسیمی دینداری خۆیان ئەنجام بدەن و دروشمەکانیان بەدەنگی بەرز بڵێنەوە، هەندێکیان سەرکەوتنە سەر کێوی (قعیقعان) (ئەو کێوەیە کە دەکەوێتە لای روکن و مەقام) لەئەویوە سەیری موسوڵمانەکانیان دەکرد[١٠٧٨] هەندێکیان لە دوای (حجر)ەوە دانیشتن[١٠٧٩] ئەوەی مابووەوە لەخەڵکی مەککە بە دووڕیز وەستابوون چاویان بڕیبووە موسوڵمانەکان لەسەر تەپۆڵکە و بەرزایەکانەوە[١٠٨٠]. پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی ڕۆیشتن لەسەر وشترەکەی (قصواء) بوو [هاوەڵان دەوریان دابوو دەیان پاراست لەمنداڵ و هەرزەکانی قورەیش بۆ ئەوەی ئازارنەدرێت][١٠٨١].

(لبیك اللهم)یان دەوتەوە و بەشمشێرەکانیانەوە خۆیان سازوئامادە کردبوو کاتێك گەیشتنە (ذي طوى)، پێغەمبەر ﷺ لەسەر وشترەکەی (قصواء) بوو وەستا موسوڵمانەکانیش بەدەوروبەرییەوە بوون، ئینجا لە (ثنیة) وە چونە ناو مەککەوە

(١٠٧٦) اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣١٤/٤) عن موسى بن عقبة.، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٨٩): رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

(١٠٧٧) اخرجه: مسلم (١٢٦٦).

(١٠٧٨) اخرجه: البخاري (٤٢٥٦)، وابن حبان (٣٨١١).

(١٠٧٩) اخرجه: مسلم (١٢٦٦).

(١٠٨٠) اخرجه: الترمذي (٢٨٤٧)، والنسائي (٢٠٢/٥)، ابي يعلى (٣٣٩٤)، وابن حبان (٥٧٨٨) وقال محققه حديث صحيح.، وقال الحافظ في (الاصابة) (٨٠/٦): اخرجه ابي يعلى بسند حسنٍ، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي) (٢٣٨٣)، وفي (مختصر الشمائل) (٢١٠).

(١٠٨١) اخرجه: البخاري (٤٢٥٥).

کەبەسەر (حەجون)دا دەڕوانێت[١٠٨٢]، موشریکەکان لەناو خۆیاندا کەوتنە قسەکردن دەیانوت: [محمد و هاوەڵانی [تاو گەرمای یەثریب بێهێزو لاوازی کردوون] ناتوانن لەبەر لاوازییان تەوافی کەعبە بکەن و ئیرەییان پێدەبردن][١٠٨٣].

ئەنەس ﷺ لەئەوبارەیەوە دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەمرەی (قضاء) دا چوو ناو شاری [مەککە وە خەڵکی مەککە وەستابوون (بە دوو ڕیزەوە) عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ﷺ [شمشیرەکەی بەدەستەوە بوو] دەڕویشت و ئەمپارچە هۆنراوەیەی دەخوێندەوە:

[خَلّوا بَنِي الْكُفَّارِ عَنْ سَبِيلِهْ ... الْيَوْمَ نَضْرِبُكُمْ عَلَى تَنْزِيلِهْ
ضَرْبًا يُزِيلُ الْهَامَ عَنْ مَقِيلِهْ ... وَيُذْهِلُ الْخَلِيلَ عَنْ خَلِيلِهِ]
[خَلّوا بَنِي الْكُفَّارِ عَنْ سَبِيلِهْ ... أَنَـــا الشَّهِيدُ أَنَّهُ رَسُولُــهْ
قَدْ أَنْزَلَ الرَّحْمن، فِي تَنْزِيلهْ ... فِي صُحُفٍ تُتْلَى عَلَى رَسُـولِـهْ]
[بِـــأَنَّ خَيْرَ الْقَتْلِ فِي سَبِيلِـهْ ... إِنِّي رَأَيْتُ الْحـَقَّ فِي قُبُولِـهْ]
[خَلّوا بَنِي الْكُفَّارِ عَنْ سَبِيلِهْ ... خَلُّــوا فَكُلُّ الْخَيْرِ فِي رَسُولِــهِ
يـَا رَبِّ إِنِّي مُــؤْمِنٌ بِقِيلِهِ] ... [أَعْرِفُ حَقَّ اللَّهِ فِي قَبُولِـــهِ][١٠٨٤].

واتە:

١- ئەی گرۆهی بێباوەڕان ڕێگەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆڵکەن ومەبنە بەربەست.
٢- ئەمڕۆ کەبەفەرمانی خوا کە لە قورئاندا هاتووە دەدەین و تارو مارتان دەکەین؟
٣- لێدانێك سەرتان لە لاشە جیابکاتەوە و بیپەڕێنێت.
٤- لێدانێك دۆستی گیانی بەگیانی لەیەکتر فەرامۆش بکات.
٥- ئەی کۆمەڵی بێباوەڕان ڕێگەی لێمەگرن و لێیگەڕێن با بڕوات.
٦- من شاهێدی بەردەوامم کە پێغەمبەری خوایە.
٧- خودای بەخشندە لە قورئاندا وای فەرمووە لەئەو پەراوەدا کە بۆ پێغەمبەر خوێندراوەتەوە.

---

(١٠٨٢) اخرجه: الواقدي (المغازي) (٢/ ٧٣٤) وهذه الفقرة أوردناه للعلم.

(١٠٨٣) اخرجه: البخاري (٤٢٥٦)، ومسلم (١٢٦٤) واللفظ له.

(١٠٨٤) اخرجه: ابن اسحاق كما في (السيرة) (٣٢٥/٣)، والطبري (التأريخ) (٢٤/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٣٢٣/٤)،، والبيت الأول والثاني عند الترمذي (٢٨٤٧)، والنسائي (٢٠٢/٥)، والبيت الثالث والرابع عند البيهقي (دلائل) (٣١٤/٤)، والبيت الخامس عند ابن حبان (٤٥٢) وغيره، والبيت السادس والسابع عند ابن هشام (السيرة) (٣٢٥/٣)، والبيهقي (دلائل) (٣٢٣/٤).

٨- ڕوون و ئاشکرایە کە باشترین کوژراوان لە پێناوی ئەو دایە من حەق و ڕاستی وا دەبینم کە ئەو پێیرازیبێت.

٩- ئەی بەرەی بێباوەڕان ڕێگەی مەگرن بابڕوات هەموو خێرێك لە پێغەمبەرەکەی دایە.

١٠- ئەی پەروەردگار من باوەڕدارم بە فەرموودەکانی وە مافی خوام ناسیوە لە وەرگرتنی ئەودا.

عومەر ﷺ فەرمووی: کوڕی ڕەواحە ئەریٚ ئەوە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ شیعر دەخوێنێتەوە و [لەحەرەمی خوا] (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لەسەر خۆبە عومەر ﷺ (لێیگەڕێ) ئەو شیعرە بەهێزترە بۆ سەردڵ و دەروونیان لە هاویشتنی تیر)))(١٠٨٥).

ئیبنو عەباس ﷺ دەفەرموێت: [(پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت هەتاچوە ناو مزگەوت] قورەیشیەکان لەلای (حجر)ەوە کۆبوونەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی هەڵبڕی (بە عەباکەیەوە) بە هاوەڵانی فەرموو: ((لَا يَرَى الْقَوْمُ فِيكُمْ غَمِيزَةً (اي: ضعفاً) [أَرْمُلُوا لِيَرَى الْمُشْرِكُونَ قُوَّتَكُمْ])) ((با موشریکەکان لاوازیتان تێدا بەدینەکەن)) [بە گورگە لۆقێ بڕۆن بۆ ئەوەی موشریکەکان هێزو تواناتان ببینن](١٠٨٦).... ئینجا خۆی و هاوەڵەکانی ڕۆیشتن بە پێهەتا دەستیاندایە (الركن الاسود) [پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن سێ قۆناغەکە بە گورگە لۆقێ ببڕن](١٠٨٧) [(چوارەمیشیان) بە ڕۆیشتنی ئاسایی ببڕن](١٠٨٨) [هیچ شتێك ڕێگر نەبوو لەبەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمانیان پێبکات کە هەموو قۆناغەکانی تر بە هەروەلە ببڕن تەنها لەبەر مانەوەیان نەبێت بەسەریانەوە کە ماوەیەك دیاری کرابوو](١٠٨٩).

---

(١٠٨٥) اخرجه: الترمذي (٢٨٤٧) وفي (الشمائل) (٢١٠)، والنسائي (٢٠٢/٥)،وابي يعلى (٣٣٩٤/٣٥٧١)، والبزار (٢٠٩٩)، والبيهقي (٢٢٨/١٠) وابن حبان (٤٥٢١/ ٥٧٨٨) وقال محققه: حديث صحيح، وصحيح الحديث كل من الحافظ (الفتح) (٦٣٨/٧) تحت الحديث (٤٢٥١)، وفي (الاصابة) (٤٦٧٦)، والشيخ الالباني في (فقه السيرة) (ص:٣٩٤)، و(صحيح الترمذي) (٢٢٨٣) و(مختصر الشمائل) (٢١٠).

(١٠٨٦) اخرجه: البخاري (٤٢٥٦).

(١٠٨٧) اخراجه: البخاري (٤٢٥٦)، ومسلم (٣٠٤٤).

(١٠٨٨) اخرجه: مسلم (١٢٦٤).

(١٠٨٩) اخرجه: البخاري (٤٢٥٦-٤٢٥٧)، ومسلم (١٢٦٦).

لەئەو بارەیەوە قوریشیەکان دەیانگوت کاتێك بە هەروەلە بەلایاندا تێدەپەڕین: دەڵێی ئاسکن [هەر بەڕۆیشتن ناوەستن بەڵکو وەك ئاسك خۆیان هەڵدەدەن] [١٠٩٠]، پاشان بە گورجی ڕاکردنی نیوان (صەفا) و (مەروە)یان ئەنجامدا تا موشریکەکان هێز و توانایان ببینن[١٠٩١].

پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای لەناوچونی لێکردن لەئەوبارەوە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکی عومرەی لەبەرکرد و عومرەی بەجێهێناو تەوافی کەعبەی کرد و پاشان ڕۆیشت ڕاکردنی نیوان (صەفا) و (مەڕوە)ی ئەنجامدا ئێمەش پارێزگاریمان لێدەکرد لەدەست خەڵکی مەککە نەوەکو کەسێك بیەوێت بیپێکێت یاخود دووچاری شتێك بێت گوێملێبوو دوعای لە ئەحزاب دەکردو دەی فەرموو: ((خوایەگیان تێکیان بشکێنیت زەوی لە ژێریاندا بلەرزێنی ئەی دابەزێنەری قورئان وخاوەنی لێپرسینەوەی خێرا تێك شکێنەری ئەحزاب خوایە تێکیان بشکێنیت)))[١٠٩٢].

خەڵکی مەککە بەژنو پیاو و منداڵەکانیانەوە کۆبووبوونەوە و سەیری پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانیان دەکرد لەئەوکاتەی کەتەوافی کەعبەیان دەکرد... کەسێك لە پیاو ماقوڵ و گەورەکانی موشریکەکان ڕقی ناو دڵیان دەشاردەوە، لەبەر ڕق وکینەو حەسادەت ولایەنی دەروونیان ڕێگەینەئەدان و چاویان هەڵنەدەهات کە سەیری پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن بۆیە ڕۆیشتن بۆ (خەندەمە))[١٠٩٣].

کاتێك تەواوبوون لە ڕاکردنی صەفا ومەروا (هدیە)کانیان هێناو لای مەروە وەستاندی و پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((هَذَا الْمَنْحَرُ، وَكُلّ فِجَاجِ مَكَّةَ مَنْحَرٌ)) واتە: ((ئێرە

---

(١٠٩٠) اخرجه: احمد (٢٧٨٢) وقال محققه: اسناده قوي، وابي داود (١٨٨٦)، وابن خزيمة (٢٧٠٧)، والبيهقي (الكبرى) (٧٩/٥)، وابن حبان (٣٨١٢) وقال محققه: حديث صحيح.

(١٠٩١) اخرجه: البخاري (٤٢٥٧).

(١٠٩٢) اخرجه: احمد (٣٥٥/٤)، وابي داود (١٩٨٢)، وابن ماجة (٢٩٩٠)، والحميدي (٧٢١٩، وابن حبان (٣٨٤٣) وقال محققه اسناده صحيح على شرطها، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (١٦٧٣).

(١٠٩٣) اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣١٤/٤)، وقال الهيثمي (المجمع) (١٠١٨٩): رواه: الطبراني ورجاله رجال الصحيح.

قوربانیگەیە وە هەموو شوێنێکی مەککە قوربانیگەیە))[١٠٩٤]. هەرلەئەوێدا (لای مەروەوە) قوربانییەکەی سەربڕی و سەریشی تاشی، پاشان خەڵکانێکی نارد بۆ ناوچەی (بأجج) هەتاکو بچن ببن بەپاسەوانی چەکەکان وە ئەوانەی لەئەوێن بێن دروشمەکانی خواپەرستی بەجێبهێنن بەئەو شێوەیە موسوڵمانەکان ئاڵا و دروشمی یەکتاپەرستی و(لبیك) و بانگونوێژی بەکۆمەڵیان لەپێش چاو وگوێی خەڵکی مەککە ئەنجامدا ئەوان دووچاری سەرسوڕمان بوون بەرامبەر بەئەو ئایینە تازەیەو پێغەمبەرەکەی وهاوەڵانی.

لە ماوەی مانەوەی لەمەککە دا پێغەمبەری خوا ﷺ خاتوو مەیمونەی مارەکرد ئەمەشی خستە ئەستۆی عەباسی مامی ﷺ کەخوشکی هاوسەرەکەی بوو کە ناوی ئوم فەضلی کچی حارثی ﷺ عەباس بوو ﷺ، لەجیاتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو چوار سەد درهەمی کردە مارەیی[١٠٩٥].

پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی سێ ڕۆژ لەشاری مەککە مایەوە، کاتێك ماوەکەی تەواو بوو داوایانلێکرد کە مەککە بەجێبهێڵێت ئەویش وەفای بەجێگەیاندو چووە دەرەوە لێی، لەئەو بارەیەوە بەراء ﷺ دەفەرموێت: (... پێغەمبەر ﷺ کاتێك چووە شاری مەککەوە و ماوەی مانەوەی تەواو بوو و موشریەکەکان نوێنەریان هاتە لای ئیمامی عەلی ﷺ وتیان: بە هاوەڵەکەت بڵێ با مەککە جێبهێڵێت چونکە ماوەکەی تەواو بوو)[١٠٩٦].

موسای کوڕی عوقبە ﷺ دەفەرموێت: کە ئیبنو شیهابی زوهری ﷺ فەرموویەتی: (...کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە بەیانی ڕۆژی چوارەمەوە سوهەیلی کوری عەمرو حووەیطبی کوری عەبدلعزا هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەئەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەناوکۆڕو دانیشتنی ئەنصارییەکان بوو لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادە ﷺ قسەی دەکرد، حووەیطیب هاواریکرد: خودا و پەیمانەکەت دەخەمەوە یاد لە خاکەکەمان بچۆرە دەرەوە [ماوەکەت تەواو بوو لای ئێمە و ئێرە جێبهێڵە]

(١٠٩٤) اخرجه: ابي داود (١٩٠٧)، و(ابن ماجة) (٣٠٤٨)، وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٤٦٤)، و(صحيح ابي داود) (١٦٧٨).

(١٠٩٥) اخراجه: ابن هشام (السيرة) (٣٢٧/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٤/ ٣١٥) عن ابن شهاب.

(١٠٩٦) اخرجه: البخاري (٤٢٥١).

سەعدی کوڕی عەبادە ﷺ فەرمووی: درۆت کرد ئێرە نەخاکی تۆیە نە بەمیرات لە باوك وباپیرتەوە بۆت جێماوە وەڵاهی ناچینە دەرەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی سوهەیل وحووەیطیبی کرد وپێیانی فەرموو: ((إِنِّي قَدْ نَكَحْتُ فِيكُمْ امْرَأَةً [وَمَا عَلَيْكُمْ لَوْ تَرَكْتُمُونِي فَأَعْرَسْتُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ، وَصَنَعْنَا لَكُمْ طَعَامًا فَحَضَرْتُمُوهُ](١٠٩٧) فَنَأْكُلُ وَتَأْكُلُونَ مَعَنَا)) واتە: ((من ئافرەتێکم هێناوە لەناوتان [ئەگەر بکرێت دەرفەتم پێبدەن لێرەدا وەلیمەی ژن گواستنەوەکەم بکەم خواردنێك ئامادە بکەم بۆتان و ئێوەش میوانی من بن] تابەیەکەوە خواردنێك بخۆین)) [وتیان: ئێمە پێویستمان بە میوانداری تۆ نییە] تکات لێدەکەین بە خواو ئەو پەیمانەی کە لە نێوانماندانە کە بڕۆ دەرەوە لە ناومان ئینجا [پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو لەمەککە]. هەتا گەیشتنە ناوچەی (سرف) لەئەوێدا خستیان (کە ناوچەیەکە نزیك لەتەنعیم)، موسوڵمانەکان مانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو ڕافعی ﷺ جێهێشتبوو تاکو خاتوو مەیمونە لەگەڵ خۆیدا هەڵگرێت لەکاتی ئێوارەدا خۆی بگەیەنێتە خزمەتی، ئەوەبوو لە (سرف) مانەوە هەتا خاتوو مەیمونە گەیشتە خزمەتی، خاتوو مەیمونە و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون دووچاری ئازار و مەینەتی بوونەوە لە سەر دەستی هەرزە و منداڵەکانی قورەیش، لە (سرف) گەیشتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و پێغەمبەری خوا ﷺ لەئەوێدا گواستیەوە و ئەو شەوە لەئەوێ بوون دواتر کەوتنەڕێ هەتا گەیشتنەوە مەدینە...)(١٠٩٨).

لەسەر کچی ئیمامی حەمزە ﷺ هەریەکە لەجەعفەر و زەید وعەلی ﷺ بوو بە هەرایان کاتێك گەیشتنە مەدینە، پێغەمبەری خوا ﷺ دوای بڕانەوەی کێشەکە دای بە جەعفەر ﷺ، لەئەو بارەوە بەراء ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەرچوو لەشاری مەککە کچۆڵەکەی ئیمامی حەمزەی ﷺ مامی کەوتە دوای و بانگیدەکرد: مامە مامە عەلی هەڵیگرت و دەستیگرت و بردیە خزمەت خاتوو فاطمە ﷺ پێیفەرموو: کچە مامەکەت بگرە و لەگەڵ خۆت هەڵیبگرە [عەلی ﷺ دەفەرموێت: کاتێك گەیشتینەوە مەدینە لەسەر ئەو کچە من و زەید و جەعفەر بووە

---

(١٠٩٧) اخرجه: الطبراني (١١٤٠)، وابن هشام (السيرة) (٣٢٨/٣)، والطبري (التأريخ) (٢٥/٣)، والبيهقي (الدلائل) (٣٣٠/٤) مرسلاً.

(١٠٩٨) اخرجه: البيهقي (الدلائل) (٣١٤/٤).

